# ریفراندۆمی کوردستان بەپێی یاسای نێودەولەتی

(ریفراندۆمی راستەقینەو و ریفراندۆمی عەبەسی)

**دەزگای ستاندەر بۆ تویژینەوە**

## ناوەڕۆك

## پێـشەکی

دوابەدوای ئەوەی دەرکەوت زۆر بەهەڵەیی باس لە ریفراندۆم و جۆرەکانی دەکرێت ، ئەو هەڵە تێگەیشتنە (بەتایبەتی لە ڕووی یاساییەوە) گەیشتۆتە ئاستی سەرکردایەتی و ئەوانەی پێیان دەوترێت (گرینۆتۆکراسی) و زۆربەی لایەنەکان، مەترسی ئەوەی لێ دەکرێ ئەو بەهەڵەییە زەرەرو زیانی گەورە بەمافی چارەنووسی کوردستان بگەیەنێت، جۆرە ڕیفراندۆمێك بکرێت ئامانجدار نەبێت، چاوەڕوانمان کرد پرۆسەی ڕێفرۆندام بەپرۆژەیەکی ڕوون و تۆکمە بێت ، وانەبوو ، چاوەڕوان بووین زانکۆکان بەو کارە هەلسن ،هەلنەستان،هەندێ دەزگای راگەیاندنی گەورەی کوردستانیش (کە خاوەنی ئیمکانیەت و سەنتەری توێژینەوەشن) ئەوان زیاتر لێی بە هەڵەداچوو بوون، بۆیە ئەو کورتە توێژینەوەیە دەکەین بۆ راستکردنەوەو هەم بۆ ئەوەی سەرکردایەتی کورد و پەرلەمان و دامودەزگای تری پەیوەندیدار سوودی مەزنی لێ ببینن.

سەرباری ئەوانەش دەستی هەندێك نوسەر و دەزگا خۆشبێت، کە باشتری بۆ چووینە و تاڕادەیەکی چاك ڕوونکردنەوەیان لەبارەی پێویستیە یاسایی و سیاسی ناوەکی داوە ،ئەوەی ئێمە زیاتر بەرەو پێویستی یاسایی وسیاسی دەرەکیە ,لەکۆتاییدا ماوە بلێین پرس و ڕاوێژمان بەهەندێ پسپۆری نێودەولەتی کرد .

## ئاستەنگەکانی بەردەم توێژینەوە

بەگشتی مەرج نیە دەوڵەت بوون لە ڕێگای ڕیفرۆندام بێت، ئەو کاتە پێویستە، کە ڕێککەوتن لەگەڵ داگیرکەرەکە دەکرێت بۆ ریفرۆندام وەك دوا چارە و دوا قۆناغی دانوستان، کەچی لێرە تەنها لەلای سەرکردایەتی کورد ئەو پرۆسەیە گەلالە کراوە، ئەوەش بەلای پرۆسەیەکی عەبەسی (لە ڕووی یاساییەوە) دەبا، هەر ئەوەش دەبێتە سەرچاوەی زۆربەی ئاستەنگەکان، وا هەندێکی لێ هەڵدەبژێرین :

1. هێشتا پەرلەمان یاسایەکی بۆ دەرنەکردوە تا ڕێڕەوی یاسایی بگرێت و ئەرك و دەسەڵات دیاری بکرێت، لە هەموی گرنگتر بزانین ئەو ریفراندۆمە (اسباب موجبە)ی چیە و (ئامانجیشی چیە) و (پرسیارەکانی ریفراندۆم چیە و کێ دیاری دەکات و وەڵامەکانی بۆ کێیە)، ئینجا ئەو دەسەڵاتە بەکێ دەدرێ بەکاریبهێنێ.
2. لە پاڵ ئەوەش تا ئەو ساتەش سەرکردایەتی کوردستان پرۆژەیەکی روونی نیە، بە نەخشە ڕێگایەك دیاری بکات، ئاخۆ چ جۆرە ریفراندۆمێکی دەوێت، چۆنی بەکار دەهێنێت، مەبەستی ڕاستەقینەی چیە؟.
3. ئەو ناوچانەی پێی دەوترێ (مادەی 140) هێشتا نەگەڕاوەتەوە، نازانرێ ریفراندۆمی لێ دەکرێ یان نا.
4. لێدوانی جیاجیای بەرپرسان لەبارەی ئەو پرۆسەیە و بێ ئەوەی ڕەچاوی پێوەرێکی یاسایی یان ئاسایشی نیشتیمانی بکرێت.
5. وا هەست دەکرێت پاڵنەر زیاتر سیاسی بێت، نەك نیشتیمانی و یاسایی، بۆیە زۆر بە زەحمەت لەنیاز و چۆنیەتی پەیڕەوی دەگەین.
6. زۆربەی ئەو حیزب و لایەنانەی سەردانیان کراو و ڕایان لێ وەرگیرا کەمتر بەلای پرسی یاساییەکەی ڕۆشتوون.

7. پرسی ریفراندۆم بووە بە کێشە و ناکۆکی، لەکاتێکدا دەبوو پرسی مافی چارەنووس کۆکەرەوەی ئاراستە لێك جیاجیاکان بوایە.

هەموو ئەوانە وادەکات، توێژینەوەکەمان زۆر قوڵ و هەمەلایەن و دووربین بێت، خوێندنەوەیەکی بەزەینیشی پێویستە، وای لێ نەخوێندرێتەوە گوزارش لە سیاسەتی هیچ لایەك بکات، بەڵکو ئەکادیمیانە بێت و گوزارش لە ئاسایشی نەتەوەیی کوردستان بکات، بەو دۆخەش ماندوبوون و وردەکاری و پشکنینی زۆری دەوێت، لەکاتی نەبونی پرۆژەیەکی دیاری کراوی سەرکردایەتی وادەکات هەموو ئەگەرەکان بخەینە بەر توێژینەوە، هەوڵ دەدەین زۆر بە کورتی و پوختی ئامادەی بکەین.

## پێناسەی ئەو ریفراندۆمەی کە بۆ کوردستان بەرهەمدارە:

لەکوتاییدا هەمو لایەك ئەو پرۆسەیان دەوێت کە لە (دەوڵەت بوون بۆ کوردستان) نزیك دەبێتەوە، لە چوارچێوەی مافی میللەتان بۆ مافی چارەنووس بەدەستی خۆی، ئەو مافەش مەرج نیە هەر بەرێگای ریفراندۆم بێ، ئەو کاتە ریفراندۆم پێویست دەبێت ئەگەر هەموو لایەنەکانی (دۆزی کورد) لە سەری رێك بکەون، واتە بەلایەنی کەمەوە (کورد و عێراق) یان زیاتریش نەتەوەیەکگرتوەکانیش بەشداربن،

جگە لەوە ڕێفرۆندامی بێ ئامانج و عەبەسی و باتیلە، پووچە (trivial) ،..خۆماندووکردن و کات بە فیڕۆ دانە .

## جۆرەکانی ریفراندۆم و ریفراندۆمی کوردستان

زۆرجۆرە ریفراندۆم هەیە لە ئەزموونی دەولەتان و میللەتان کراوە،ریفراندۆمی (ئیلزامی – ئیختیاری – ئیستشاری - سیاسی – دەستوری- تەشریعی..) ،لەوەدەمە نمونەی تورکیا ئەنجامدرا لەو رۆژانە، یان بەریتانیا بۆ دەرچوون لە یەکێتی ئەوبورپی،یان ریفراندۆم بۆ بەرجەستەی دەستورەکان ،یان ڕاپرسی لەسەر هەر دۆزێك کە بە یاسا یەکلا نابێتەوە .. هەمو ئەوانە ئەوەندە لە ئەزمونی کوردستان نزیك نینە، جۆرێکی تریش هەیە لە ریفراندۆمی سەربەخۆیی وەك جیابوونەوەی سلۆڤینیا لە یۆگوسلاڤیا سالی 1990،تەتەرستان لە روسیا سالی 1991،کرواتیاو دوای بۆسنەو هەرسەك لە یۆگوسلاڤیا لەسالی 1992،مەقدۆنیا و جۆرجیا وئۆکرانیاو مۆنتینیگرۆ لە سربیا سالی 2006، دوای چیك وسلۆڤاکیا دابەش بوون ،زۆری تر ,جاریش وابوە ریفراندۆم سەرکەوتوو نەبوە وەك ئەوەی لە کیبیك کرا سالی 1999 ریذةی 51% داوای مانەوەیان کردو جیا نەبوونەوة، ئەوانە کەمێك نزیك ترن لەدۆخی  قانونی کوردستان ، ڕێفراندۆمی کوردستان بۆ سەربەخۆییە لەو جۆرانە نزیکن کە میللەتانی بێ دەولەت کردوویانە بۆ بەدەولەت بوون، سەربەخۆبوون، ئەویش زیاتر لە (مافی چارەنووس) باس کراوە و لە ئەزمونەکانیش بەرجەستە کراوە، بەگشتی دوو بەشە : **یەکەمیان** بۆ ئەوانەی پێیان دەوترێ (اقالیم الاستعماریە- بە پێناسی بریاری  1467 جمعیة العامة )، لە بەندی 13ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان (مادەی 73 و74)وەسفی یاساییان دەکا ،بۆ ریفراندۆمیش لە برگەی (ب)ی مادەی 76ی (بەندی 13)هەمان میساق هاتوە، بەڕاستەوخۆتر لە (بنەمای 7ی)بڕیاڕی نەتەوە یەکگرتوەکانی ژ:1467 خولی :14 ی سالی 1959

هاتوه ،ئەوانەن كە لەلايەن ئيستعمارى كۆن داگيركراوە، كۆمەلێك برپارپيشيان بۆ دەرچوە لەهەموان ڕوون تر برياری 1514ی ئەنجومەنی ئاسایشه، چەندين بڕياری تر دەيان گرێتەوە،كە بە (مافى چارەنوس)ناوزەد دەكرێت .

**دووەميان** بۆ ئەو ميللەتانەی كە داگيركراون لەلايەن دەوڵەتێكی محەلی، وەك نێوانی ئەريتريا و ئەسيوپيا، خواروی سودان و سودان، تەيمور و ئەندۆنوسيا، كۆسوڤۆ و سربيا،كشمير وهند ، هەر چوارپارچەی كوردستان و ولاتانی سەردەستەيان...زۆری تر.

ئەو دوو دۆسيەيە(يەكەم ودوەمی سەروو) لە ياسای نێودەولەتی زۆر لێكجيايە، بەداخەوە لەكوردستان لەلايەن سەركردايەتی و بەشێكی زۆری تر خراپ تێكەڵ كراون، ئەو ريفراندۆمەی وا باس دەكرێت لەچوارچێوەی ئەو هەڵە تێگەيشتنەيە، لە يەكەما (واتە هەرێمەكانی سەر بە ئيستعمار) مافی چارەنووس بە هەموو بڕيار و ڕێكەوتننامە دەوليەكان دەيان گرێتەوە، بۆيە وەك دۆزێكی ڕەوا لەجيهان باس دەكرێت و بڕياری (1514) ناوی نرا (تصفيه الاستعمار) كۆتايی هات ميللەتانی ژێر دەستی ئيستيعمار دەتوانين بلێين نەما، يان سەربەخۆيی وەرگرتوە يان خۆی داوای مانەوەی كردووە،يان بە مۆلەقە ماونەوە وەك: كورسيكا لەگەل فەرەنسا ، باسك لەگەل ئيسپانيا، هەندێ دورگەی تر ناتوانن بكەونە سەر پێ ی خۆيان، بۆ ئەوانە ريفراندۆم ئۆتۆماتيكی هەيە، هەرچی دووەما زياتر كێشەكانی جيهانی نوێ پێك دەهێنێ كە دۆزی كوردستانيش لەوێ خۆی دەبينێتەوە ، زيار ياساناسانی نێودەولەتی ناويان ناوە (حق الانفصال secession) پێ ی نالێن (حق تقرير المصير- مافی چارەنووس Self Determination يان independence)) بەڵكو دەڵێن مافی جيابونەوە، هەردوولای يەكەم ودوەم مافيانە ،بەڵام ڕێڕەوی ياساييەكەی جيايە، (مافی جيابونەوە) يەكلايەنی نيە،،(هەرەوەك )دۆسيەی كۆسوڤا لەدادگای لاهای ئەو ناوەی هەلگرتبوو (بڕوانە جەلسەی 120 ی خولی :64ی كۆمەلەی گشتی ڕۆژی 2010/9/9)، دەقەكەی (كە بە پێی بەلگەنامەی (7/Rev.96S/) عەرەبيش بەدەق هەژماردەكرێ لە نەتەوە يەكگرتوەكان) : (أن الانفصال من جانب واحدلايمكن أن يكون وسيلة مقبولةلتسويةالمنازعات الإقليمية .الا فی الحالات التی حددتها الجمعية فی جلسة (120 ) لعام (2010) ئەويش بريتيە لەو 3 مەرجەی بۆ سەربەخۆيی كۆسوڤا هات لە دادگای لاهای لە - لە خواروو باسكراوەئەو كاتە پێی دەووترێ (حق انفصال علاجی) , واتە بە تەنها ناتوانی بڕيار لە مافی چارەنووسی خۆت بدەی وەك ئەوەی لە ( اقاليم الاستعماريه) ڕوويدا، دەبێت تێكۆشينی هەمە لايەنە بكەی بۆ ئەوەی بتوانی لە (مافی جيابوونەوە) خۆت وەرچەرخێنی بۆ (مافی چارەنووس)، تا ڕادەيەك كۆنگرەی ڤيەننا كە لە 14-1993/6/25 يارمەتيدەرە و بۆيەكەم جارە ئاماژە بەميلەتانی بەشی دوەم دەدا لەو پەرەگرافەی: ( للشعوب الخاضعة للسيطرة الاستعمارية أو غير ذلك من أشكال السيطرة الأجنبية أو الاحتلال الأجنبي).

كاری ميلەتانی بەشی دوەم زۆر قورسە ,هەر بە قسە و ڕاگەياندن نيە بەڵكو كاری ناوەكی و دەرەكی پێويستە، لەناوەكی بينای دەولەت بكەی لە سيستەمی ياسايی و ئابوری و سياسی و ئيداری و مرۆيی، لەدەرەوەش كار لەسەر ياسای نێودەولەتی بكەی بۆ ئەوەی لە نەتەوەيەكگرتوەكان ناوی ميللەتەكەت بە (شەعب) تۆمار بكەی تا مەرجەكانی مادەی يەكەمی (كۆنگرەی مۆنتيڤيديۆ بيگرێتەوە دەقەكەی ( The

state as a person of international law should possess the following qualifications: a ) a permanent population; b ) a defined territory; c ) government; and d) capacity to enter into relations with the other states) چونكە تائێستا كورد بە دانیشتوان وهاولاتی تۆمارە لە نەتەوەیەكگرتوەكان نەك گەل وەك لەهەردوو بڕیاڕی 688 و 986 بە ڕووونی هاتوە، ئینجا پێویستە لە تۆماری نەتەوەیەكگرتوەكان (حركه الوطنیه)هەیە بە پێی مادەی (74)ی (نظام الداخلی للمجلس الاقتصادی والاجتماعی) ئینجا بڕیاڕی (1654) سالی 1961 لە خولی ژ: 16ی د:59 خۆت تۆمار بكەی,، تا ڕادەی بەشداری لە (نەتەوەیەكگرتوەكان) ئەندام بیت بە سیفەتی چاودێر، بۆ ئەوەی دۆسیەت هەبێت لەنەتەوەیەگگرتوەكان... سەركردایەتی كورد هێشتا ئەوانەی نەكردوە .

ئەوانەی بەشی دووەم بە رێگای جیاجیا گەیشتون بە سەربەخۆیی، مەرج نیە ریفراندۆم تاكە رێگابێت، ئەنگۆلاو مۆزەمبیق وپیشووتر سەربەخۆیی وولاتانی رۆژهەلاتی ناوەراست و زۆری تر بێ ریفراندۆم بوە ، ئێستاش كیشەی نیوان ئیسرائیل و فلستین ریفراندۆمی پێویست نیە ، كوردستانیش ریفراندۆمی پێویست نیە چونكە تاریخ وجوگرافیاو 100 سالی خەبات وەلامی ئەو پرسیارەی بۆهەمو جیهان دایتەوە ئاخۆ چی دەوێت ، زیاتر ئەو میلەتانە پێویستیان بە ریفرۆندامە كە گومان لە ئیرادەی میلەتەكە هەیە بۆ سەربەخۆیی .

**تیبینی :** جۆرێكی تریش هەیە لە ریفراندۆم لە نێوان توخمە بنچینەییەكانی دەولەتی تەوافوقی وەك ئەوەی لە نێوان چیكوسلوڤاكیا كرا و لێكجیابوونەوە ، بەلام مانای قانونی تەوافوقی لەوێ زۆر جیایە لەوەی لەكوردستان خۆبەخۆو لە عێراقیش خۆبەخۆ باس دەكرێ .

## ئەزمونە نوێیەكانی میلەتانی بەشی یەكەم :

چەند ئەزمونێك ڕێنیشاندەرێكی باشە بۆ هەر ڕێفرۆندامێكی ڕاستەقینە لەكوردستان بیكەین، لەوانە (ئەریتیریا – تەیمور- خواروی سودان- كۆسۆڤۆ..) ، هەریەكە لەگەل دەولەتە داگیركەرەكە رێكەوتنیان كرد ، لە ریفرۆندامی جزائر دەست پێدەكەین بۆ سەربەخۆیی كە بە پێی ڕێكەوتنی ئیڤان ساڵی 1962 هاتەدی لە نیوان بەرەی رزگاری جزائر و دەولەتی داگیركەری فرنسی ، ئەریتریا ریفراندۆمی كرد لە ئەنجامی ریكەوتنی نێوان (الجبهة الشعبیة لتحریر ارتریا ) وحكومةتی نویی ئەسیۆبیا لەسالی 1991, رێكەوتنی نێوان تەیموربەسەرۆكایەتی (جۆسماو) و ئەندۆنیسیا بە ئامادەبوونی نەتەوە یەكگرتوەكان بوو لە ساڵی 1999، جۆری پرسیارەكەش ئەوەبوو (ئۆتۆنۆمی یان سەربەخۆیی) لە 1999/8/30 ریفرادۆمەكە كرا لە 80% داوای سەربەخۆییان كرد، بوە شەڕ دوای هاتنی هیزی دەولی لە 2002 سەربەخۆییان وەرگرت .

كێشەی (سەحرای غەربی) زۆر تایبەتە چونكە شێوەیەكە لە یەكەم ودوەم ،لەژێر دەستی ئیسپانیا بوو، لەساڵی 1976 جاڕی سەربەخۆیی داوە بەلام یەكلایەنە سەركەوتوو نەبوو زۆر ئالۆزتری كرد، مەغریب و مۆریتانیاش داوایان دەكردەوە ،بەرەی پۆلیساریۆش داوای سەربەخۆیی دەكرد ،ئەو دۆسیەیە چوە دادگای لاهای ،ئەویش وەلامی بەوە دایەوە كە شمولی بڕیاڕی 1514 دەكات (واتە سەربەخۆیی) ،ئیسپانیا ریكەوت لەگەل پۆلیساریۆ لە سالی 1975 كەبەناوی ریكەوتنی مەدرید ناوزەد دەكرێت ،كشایەوە ، بەپێی

بریاری 1514 نەتەوە یەکگرتوەکان ڕێی ڕیفرۆندامی پێداوە ، دوای ئەوەی زیاتر لە 70 وولاتیش دانیان پێدا هێنا ئینجا شای مەغریبیش هاتە ڕایێ ،بەلام هەروا مەغریب کێشەی بۆ دروست دەکا نەکراوە .

خوارووی سودان ریکەوتنی نیڤاشیا بریاری ژ:1590 مادة 4 لةنەتەوة يةكگرتوةكان دةرچوو بۆ ريفراندۆمی خوارووی سودان , برگەی (أ و ها) لە بەندی (3) پرۆتۆکۆلی (مشاكۆس) تیایدا دوای 6 سال ريفراندۆم بكريت لە مادةی (225)ی دەستوری سودانیش ئەو ریکەوتنە تۆمارکرا, دوای کرا و سەربەخۆییان وەرگرت، تەنها کۆسۆڤۆ بەو شێوەیە نەبو، بەڕێکەوتن نەبوو لەگەل سربیا، بەڵام ئەوکاتە کردیان کە سربیا کەوتە ژێر بەندی (7)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان ، هاوپەیمانان پشتیان گرت و ريفراندۆمەکی یەکلایةنی کرد , سربیا قایل نةبوو دۆسیەکە چوە لای دادگای لاهای ناچار ئةو پشتیوانیة دةولية تةنها توانی لة دادگای لاهای (محكمة العدل الدولية) لة 2010/7/22 یەکلا بکرێتەوە، بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:

بەپێی بڕیاڕی ( الجمعية العامة –د:64 بند:77 8سبتمبر2010) دۆسیەی کۆسۆڤاچوە دادگای لاهای ئەوەش دەقی وەلامی دادگایە :( أعلن هيساشي اوادا رئيس محكمة العدل الدولية في قصر السلام في لاهاي إن المحكمة "خلصت إلى أن " إعلان الاستقلال في 17 شباط/فبراير 2008 لم ينتهك القانون الدولي العام") ، بەلام تا ئەو ساتەش نەبۆتە ئەندام لە نەتەوەیەکگرتوەکان .

ريفراندۆمی سێ نمونەی تریش هەیە هەریەکە بەجۆرێك، کبيك و کەنەدا، سکۆتلەندا و بەريتانيا، کەتەلۆنیا و ئیسپانیا..ئەوانە هەریەکە خوێندنەوەی یاسایی ودیموکراسی خۆی هەیە ، زۆر جیایە لەگەل دۆخی یاسایی کوردستان ،جیاوازیەکە لەوە دێت ئاستی دیموکراسی بەريتانياو کەنەدا لەگەل ئاستی دیموکراسی و بەرپرسیاریەتی عیراق زۆر لێکدوورن ، دۆزی گەلی فەلەستین ريفراندۆمی ناوێت دانی پێداهێنراوە گەلی فەلەستین، ئیسرائیلیش بە (داگیرکەر) تۆمارکراوە..

**لەوانەوە چەند خالێکی گرنگمان دەست دەکەوێت بۆ ئێستای کوردستان:**

1. ڕێفراندۆمەکانی هەریمە ئیستعماریەکان جیان لەگەل ئەو میلەتانەی لە ژێر دەستی وولاتێکی وەك ئەسیۆبیاو ئەندۆنیسیاو عیراقدایە ..ئەوانەش لەگەل ئەزمونەکانی نێوان(کبيك وکەنەدا، سکۆتلەنداو بریتانیا) .
2. زۆربەی دەولەتانی جیهان هاندەری هەریمە ئیستعماریەکانن ومیلەتانی ژێر دەستی ئیستعمار بۆ سەربەخۆیی ،بەلام ئەو سۆزیە بۆ میلەتانی (بەشی دوەم) زۆر کەمترە، ئەوەندە پێی مورتاح نین ، لەزۆربەی بڕیاڕەکانی مافی چارەنوس بۆ میلەتانی بەشی یەکەم برگەیەکی تێدایە کە داکۆکی لەسەر سیادەو یەکپارچەیی دەولەتان دەکاتەوە (لەخواروو زیاتری باس دەکەین) .
3. ئەوجۆرە میلەتانە ناتوانن ريفراندۆم یان هەر جۆرە بڕیاڕێکی یەك لایەنی لەبارەی چارەنووسی خۆی بدات، مادام ئەو وبڕیاڕە زەوت کراوەو کەوتۆتە دەست وولاتێکی تر خاوەنی سیادەیتی (sovereignty) ، ئەو کاتە دەکرێت کە خاوەنی سیادە (واتە دەولەتە داگیرکەرەکە – سەردەستەکە)ڕەزامەندی فەرمی لەسەر بدا .
4. هەمو ئەو ڕێفراندۆمانەی کراوە لە ڕێگەی ریکەوتنامەی فەرمی بوە لەگەل خاوەنی سیادە .

5. ریفراندۆمەکان لەدوای ریکەوتن هاتوە نەك لە پێشی .
6. ڕێفراندۆم کردن بۆ دانوستان وگفت وگۆ نیە بەلکو لەدوای گفت وگۆو دانوستان وەك دوا هەنگاو دێت ،هەنگاوی یەکلاکەرەوە .
7. هیچ ریفراندۆمێك نەکراوە بێئامانج عەبەسی  بلێی ریفراندۆم دەکەم وەك کارتەك لەدەستم تا جیهان بزانی میلەتەکەم چی دەوێت ئەوە نەبووەوە نەکراوە .
8. زیاتر ئەو میلەتانە بەرەو ریفراندۆمن کە گومان لە ئیرادەی سەربەخۆ بوونیان هەیە ، ئەو گومانەش داگیرکەرەکە دەیچێنی ،بۆیە نابێت سەرکردایەتی میلەتەکە خۆی داوای ریفراندۆم بکات .

## ریفراندۆمی کوردستان

مەلەفی یاسایی کوردستان بەگشتی و هەرێمی کوردستان زیاتر دەکەوێتە پۆلی دووەمی ( ئەوەی لەسەروو) باسمان کرد، واتە (مافی جیابونەوە )،هەرچەندە کوردستان وەك فەلەستین و ئەریتیریا و کۆسۆڤۆ .. نیە، مەلەفە مێژوویی و جوگرافی و نیبشتیمانیەکەی زۆر بەهێزە، بەلاَم نەکراوەتە بە مەلەف و بەکاربهێندرێت، بەهەولێکی کەم دەتوانرێ مەلەفە یاساییەکەی لە (مافی جیابونەوە) وەرچەرخێنێت بۆ (مافی چارەنووس) ئەوکاتە پێویست بەوە دەکات :

1. هەنگاوی یاسایی بۆ وەرچەرخاندنی (مافی جیابوونەوە) بۆ (مافی چارەنوس) بریتیە لە دروست کردنی مەلەفێکی قانونی (کە لە :الملف القانونی لحق تقریر مصیر کوردستان وفق قوانین الدولیه)کردومانە ئەوەش لینکەکەیەتی: <http://www.skurd.net/old1/index.php/2014-07-26-15-02-03/888-2014-11-17-15-12-33>
بۆ ئەو وەرچەرخاندنە سود لە ڕێکەوتنی نێوان (دەولەتی سودان و جنوب سودان) –پرۆتۆکۆل مشاکۆس بکەن کە تیایدا دان بەمافی چارەنوس نرا بۆ ریفراندۆمێك ، ئیتر دۆسیەکە لە (مافی جیابوونەوە وەرچەرخا بۆ مافی چارەنوس) و لەدەستوری سودانمادەی (219 و 222)تۆمارکرا .
2. شەرم نەکات کە خۆی بە (مستەعمەرە) بناسێنێت و دەولەتی عێراق بە (ئیستیعمار) پرۆسەکەش بە داگیرکاری بە پێی برِیارِی ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئوکتوبەر/1970 .
3. زۆر بە ووردی ڕەچاوی ئەو مەرجانەی سەربەخۆی کۆسۆڤا لەلایەن (دادگای لاهای)بکرێت کە لەخواروو تۆمار کراون .
4. یان بەلای کەم میللەتی کورد بە (شعب)ێکی جیا لە عەرەب لە فەرهەنگی نەتەوەیەکگرتوەکان تۆماربکات، چیتر نەوترێت (سکان الاکراد)، وەك لە مادەی (1)ی بریاری 688 هاتوە، لەکاتێکا میللەتی فەلەستین و سەحرای رۆژئاوا بە (شعب) ناودەبرێن، لەنەتەوەیەکگراوەکان مافی یاسایی (هاولاَتی) (سکان- دانیشتوان) (گەل – شعب) زۆر لەیەکتر جیایە، کە بوە(گەل) ئەوا بەپێ ی مادەی(1)ی کۆنگرەی مۆتیڤیدیۆی 1933 بوون بەدەولَەت دەیگرێتەوەو بەئاسانی دەچێتە  مادەی (1)میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان وهەمو ئەو بڕیارانەی بەهۆیەوە دەرچوە ، واتە کە دەلێین مافی چارەنووس پێوەری یاسایی هەیە چ جۆرە میللەتێك دەگرێتەوە، نەك هەموو ...ئەوانە هەمو لە پێشن ونەکراون .

5. ئەو کارانە ئاسان تر بوو لەو سەردەمەی عێراق لەژێر بەندی (7) بو(عیراق بة بريارِی ژ:2017 ی ئەنجومةنی ئاسایشی لیی دةرچوو)، ئێستا زۆر زەحمەتە چونكە سیادەی عێراق گەڕایەوە بەسەر هەموو خاكی عیراق، بەهەرێمی کوردستانیشەوە.
6. واتە نە حكومەتی هەرێم نە حیزبەكان خاوەنی سیادەی هەرێم نین، بە پێی یاسای نێودەولەتی دەولەتی عێراق خاوەنە، بۆیە هەر بریارێكی دەسةلاتی كوردی پێ ی دەلێن یەكلایەنی بەو دۆخەی ئێستای، بەتایبەت ئەگەر پەڕلەمان و دام و دەزگا یاسایی بەكارنەهێنی، بەرگەی تانەیەكی (دادگای ئیتحادی عێراق) ناگرێت.

## ئەو ریفراندۆمی دەسەڵاتی كوردی دەیكات:

لە راستیدا تا ئەو ساتە بە ڕوونی دیاری نەكراوە ئاخۆ چیان لەو ریفراندۆمە دەوێت؟ دوایی چی لێدەكەن؟ لێدوانی جیاجیا هەیە، لەسەر هەریەكەیان بەپێ ی رێكارە یاساییەكانی نێودەولەتی لەسەری دەوەستین:

1- ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی
2- ریفراندۆم بۆ كۆنفیدراڵی
3- ریفراندۆم وەك كارتی دانوستان
4- ریفراندۆم تا بزانین ئەو میللەتە چی دەوێت
5- ریفراندۆمی سەپاندنی ئەمری واقع ( دیفاكتۆ)

هەریەكە بە پێی پێویست ڕوونیان دەكەینەوە بە ڕوانگەی یاسای نێودەولەتی :

### 1- ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی كوردستان

ئەوەیان هەموو خەڵكی كوردستان و لایەنە سیاسیەكان لەسەری كۆكن، ئامانجی هەموو شۆڕش وراپەرینەكان لەدوا قۆناغ بۆ ئەوە بووە، جا چ جاڕدرابێت یان شاراوە بێت، ئەوەش پێویستی بە بناغە و داڕشتنی یاسایی و سیاسی و كۆمەڵایەتی و ئابوری و ئەخلاقی هەیە، ئەو كارە ئەوەندە ئیعلامی و گوتاری نیە، چونكە بە جاڕدان و ڕاگەیاندن دروست نابێت، یاسر عەرەفات لە ساڵی 1988 دوە جاڕی دەولەتی فەلەستینی داوە سەرەڕای ئەو هەموو پیشتیوانیە نێودەولەتیە و بڕیاری(242)ی نەتەوە یەكگرتوەكان ،كەچی چونكە ئامادەكاری نەكردوە سەركەوتو نەبوون،بەهەمان شێوە(ئەرزی سۆمال لە سالی1991) دوە ئەو جاڕەی داوە بێهودە بوە ،لەسالی 1970دوە وەك دیفاكتۆ بەنگلادیش سەربەخۆ بوو وجاڕیشی دا بەلام تاسالی 1974 ريكەوتن لەگەل پاكستان ئینجا وەرگیرا لە نەتەوە یەكگرتوەكان بۆ دەولەت بوون ، واتە ئەو پرسە ووردەكاری ناوەكی و دەرەكی هەمەلایەنی دەوێت، لەپێشدا پێویستە مەلەفێكی (یاسایی و سیاسی) بۆ دروست بكەی(بڕوانە ئەو مەلەفەی ئێمە : الملف القانونی لحق تقرير المصير لشعب كوردستان وفق قوانين الدوليه) .

بۆ کوردستان (بە پێی ئەو بارودۆخە قانونیەی ئێستای هەرێم)بەدوو شێوە دەبێت، یان لەڕووی قانونیەوە بتوانێ لە مافی جیابونەوە خۆت وەرچەرخێنیە (مافی چارەنووس) کە ئەوە راستەقینەیە، وەك لەسەروو باسکرا وعێراقیش بەداگیرکەرپۆلین بکەی تا بکەوێتە چوارچێوەی مادەی (8) بڕیاڕی (3330- د:22، 1977) و، بڕیاڕی 2105 ی نەتەوە یەکگرتوەکان، هەروەها لە بڕیاری ژ:2625ی خولی 25ی 24/ئۆکتۆبەر/1970 هاتوە، پێ دەچێ ئەوە زەحمەت بێت با هەقیش بێت، بەدیلی ئەوەش گەڕانەوەیە بۆ(مافی جیابونەوە)، ئەوەیان جۆرە رێکارێکی تری یاسای نێو دەولەتی دەوێت ،هەرە نزیکەکانی لە دۆزی کورد بریتیە لە(رەهەندە یاسا نێودەولەتیەکەی):

1. بڕگەی (2)ی مادەی (1)ی کۆنگرەی ڤیەنای سالی 1993.
2. ئەو دۆسیە قانونیەی کۆسۆڤا و وەلامی دادگای لاهای بۆ نەتەوەیەکگرتوەکان کەلە بڕگەی 81ی فتوا یاساییەکەی دادگای رۆژی 2010/7/22 هاتبوو .
3. ئینتما کردن بۆ هەردوو لیژنەی (لیژنەی دەولی بۆ مافی چارەنوس بە پێی راسپاردەی خولی 16ی (جمعیە العامە)ی سالی 1961، هەروەها لیژنەی (الحرکە الوطنیە)کە لة مادەی (74)ی پەیڕەوی ناوخۆی (مجلس اقتصادی واجتماعی)نەتەوە یەکگرتوەکان هاتوە .

هەمو ئەوانە ساناتر بوو لەو فەترەیەی (1990- 2013)عێراق لە ژێر بەندی (7) بو زۆرجیایە لەگەل ئێستا، کاتێك عێراق بە پێی بڕیاڕی (661)کەوتبوە ژێر بەندی (7) نزیکەی (65) بریاری لەسەر دەرچووبو، خاوەنی سیادەی تەواوی عێراق نەبو، بەتایبەتی کوردستان بە هۆی دو بڕیاڕی گرنگ بوار هەبوو سودی لێوەرگیرێت بەو ئاراستە قانونیە، بریاری 688 و بریاری 986 ، ئەویش ئیشی دەویست ئەگینا لە خودی ئەو دوو بڕیاڕەش باسی سیادەی عیراق لەو ناوچانەدەکا، بەلام گرنگ ئەوەیە سیادەکە لەدەست نەتەوە یەکگرتوەکانە وەك لەو دوو بڕیارە هاتوە، دوای ئەوەی عێراق بەپێ ی هەردوو بڕیاڕی 2299ی و بریاری (ژ:2017 ) لەبەندی (7) دەرچووو, ئێستا خاوەنی سیادەی هەمو عێراقە وەك لەدەستپێکی بڕیاڕەکە(2299) باس لە گێڕانەوەی سیادە دەکا، واتە بەپێ ی قانونی دەولی ئێمە لەکوردستان (یان حکومەتی هەرێم) خاوەن سیادەی (هەرێمی کوردستان) نین، لێرەوە گرێ کوێرە قانونیەکە قووت دەبێتەوە کە زۆربەی لایەن و سەرکردەکانیش تەواو ئاگادار نین، واتە ئێمە بە یەك لایەنی ناتوانین بریاری مافی چارەنووسی ئەو هەرێمە و میللەتەکەی بدەین، هیچ لایەکی قانونی ئەو دەسەڵاتەی بەئێمە نەداوە،کەواتە دەبێت ئەو تەفویزە وەرگرین، لەو دەمە (واتە لەدوای دەرچونی عێراق لە بەندی 7) هەردەبێ عێراق ڕەزامەندی بدات، هەرواش کراوە لە ئەزمونە قانونیەکانی جەزائیر، ئەریتیریا، تەیمور، خواری سوودان.. ئەوانە رێکەوتنیان لەگەل (صاحب السیادە) کردووە، (صاحب السیادە ) باداگیرکەریش بێت، ئەگەر عێراق رێك نەکەوێت لەگەل هەرێمی کوردستان، هەر ریفراندۆمێك بکەی لەڕووی یاساییەوە باطلە، پوچە، قیمەتی قانونی نابێت، تەنها ماندووبوون و ئەزیەتە، ساڵی چەند جارێك ریفراندۆمی لەو شێوەیە بکەیت یان نەیکەی، هەروەك ریفراندۆمی ساڵی 2005 دەبێت و بەس, ، ئەگەر وابوایە وەك ئەوەی ئێستای دەسەلاتی کوردی دەیەوێ بیکات لە شۆرشی ئەیلول دەیکرد(بەتایبەتی لە نێوانی 1970 تا 1974) ئەو هەمو خوێن رشتنەی ناویست ،یان هەر لە ئەسلدا میلەتانی ژێر دەستە پێویستیان بە شۆرش نەدەبوو ،شۆڕش و ڕاپەڕین بۆ

ئەوەیە تا ئەو مافە بەدەست بهێنی (مافی چارەی خۆ نووس) کە لەدەستت نیە .

**بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ عێراقیش زۆر دەرفەتی زێرین لەدەست چوو، دەبوایە :**

ا- لەکاتی نوسینەوەی دەستور مادەی وای تێدابخرایە نەك ئەو ئاماژەیەی لەدیباجە هاتووە، یان بەلای کەم لە دەستورەکە مادەیەك تۆماربکرابایە بووترایە (دیباجەکە) بەشێکە لە دەستوور.

ب- لەکاتی دەرچونی عێراق لە بەندی (7) کە سەرکردایەتی کورد و ڕۆڵی گرنگی لێ ی بینی دەبوایە دووبارە (وەك ساڵی 1932 ئاسا 16 تەعەهود لە عێراق وەرگیرا) بەلێننامە لە عێراق وەربگیرایە و بواری قانونیش هەبو، جینۆساید و ئەنفال و یاساکانی نێودەولەتی..پالپشت بوون .

ج- لەبارەی فیدراڵی تەواویش تۆمار نەکراوە، بۆ ئەوەی عێراقیکی فیدراڵی بوایە، دەبو (3) هەریمی فیدراڵی هەبوایە، ئەوکات بۆ هەموو هەنگاوێك ساناتر دەبوو، هەم ناوچە ناکۆکەکانیش کوردستانیش تا ئێستا چارەسەر دەبوو.زهەم سیادەی عیراق شل تر دەبۆوە .

د – تەوافوقی تەواو یان شراکە : هێشتا سەرکردایەتی کورد نەیتوانیە سیستەمی سازان(توافق) بۆ مافی چارەنوس بەکاربهێنێت ، هیشتا ئەو سیستەمە جێبەجی نەکراوە لەعیراق هەرچەندە دانی پیا هێنراوە ، نەهاتوون وەك ئەزمونە تەوافوقی چیکۆسلۆفاکیاو قوبرس بکەنە سەرمەشق کە زۆر لە قازانجی کورستان دەبوو ، ،هاتوون زیاتر ئەزمونی تەوافەقی لبنانیان بەرجەستە کردوە کە تەنها تەوافوقیەکە لە سەروو جێبەجی کراوە شۆڕ نەبوویەتەوە خوارەوە، چونکە لە ئەزمونی چیکۆسلۆڤاکیاو قوبرس دەولەتەکە تەوافوقیە هەرچی لە لبنانە حکومەتەکە تەوافوقیە نەك دەولەت ، تەوافوقی و ئیئتلافی و حکومةتی بنکة فراوان وحکومةتی یەکڕێزی و حکومەتی (شەراکە) ...هەموی لێک جیان ، دەولەتی تەوافوقی گۆڕانکاریەکانی ستونیانە لەسەروو تا خواروەو ، بە پێچەوانەی حکومەتی ئیئتلافی ئەگەر هەر گۆڕانێک بێتە دی ئەوا تەنها ئاسۆییانە لە کابینەی ئەنجومەنی وەزیران ڕوودەدات ،شۆڕ نابێتە خوارەوە ،کەچی لە دەولەتی تەوافوقی هەر گۆڕانکاریەک بێتە دی بە هەر هۆیەک بێت (تەوافوقیانە بێت یان بە ئەنجامی هەلبژاردن بێت) ئەوا لە کابینەو باقی دام ودەزگاکانی خواروو تریش ڕوودەدات ،تەنانەت دەپەڕێتەوە بۆ دەسەلاتەکانی تری وەک پەرلەمان ودادگاو سوپا وپۆلیس و ئاسایش ، هەندێکیان تەوافوقیان بە دەستوریانە هەندێکیشیان بێ دەستوری، لوبنان بەبی دەستوریە سەرۆک کۆمار مسیحیەکی مارۆنی بیت , سەرۆک وەزیران موسولمانی سونە بیت .سەرۆکی پەرلەمان شیعەی موسولمان ، سوپا سالاری گشتی مارۆنی وەزیری دەرەوە مسیحی ئەرسەدۆکسی ،وزیری بەرگری دورزی ، کەچی لە قوبرس و چیکۆسلۆڤاکیا دەستوری بو لەو شێوەیەیەی خوارەوە : چیکۆسلۆڤاکیا لەدوومیلەتی جیای چیک وسلاڤ پێکهاتوە , ٦٦%ی چیک و٢٨%سلۆڤاک وکەمایەتی تریش، قوبرسیش بە پێی دەستوری ١٩٥٩ تەوافوقیانە ڕێک کەوتن لە سەر بنچینەی ڕێژەی پێکهاتەیی، بە جۆرێک ٦٠%کبرسی یۆنانی وباقیەکەی تر تورک وکەمایەتی ترن سەرۆک کۆمار یۆنانی جیگری تورک، ٣٥پەرلەمانتار یۆنانی و ١٥ تورکی ، ٧ بە ٣ وەزیریش، .. ، عادەتەن لەو جۆرە سیستەمی پەرلەمانی دەبێت نەک سەرۆکایەتی , ئەگەر عیراق ئاوا تەوافوقی بەرجەستە بکات کاری مافی چارەنوسی کوردستان زۆر سانا دەبێت ، ئەو کاتی خۆت شەریکی پێویستت بەوە نیە ئەو مافەی خۆت لە میلەتێکی تر داوا بکەی بەلکو ڕێکاری یاسایی ئۆتۆماتیکی دێتە پیش .

هەر بۆزانین له ریکەوتنی نیوان (خوارووی سودان)و (دەولەتی سودان) واکرا لەمادەی (80)ی دەستور بە تەوافوق سودان بەڕێوە ببەن بە میکانیزمی 70% بۆ دەولەت و 30% بۆ خواروو .

خ - دوا دەرفەت ئەو رێکەوتنه(8 مادەیه)بوو کە لە 2016/7/22 کرا لەگەل پنتاگۆن و عێراق و بەوهۆیە هێزی پێشمەرگە (بەبێ مۆڵەتی پەرلەمان) بڕیاری بەشداری لە شەڕی موسڵی دا سەکردایەتی کورد دەیتوانی بەرامبەر ئەوە هەر خواستێکی هەبێت ئاسانترە لەوەی ئێستا شاندێك بنێرێتە بەغدا بێ ئەو کارتە.

دەبێ ئاگادار بین بەووردی ڕای دەولی بۆ جیابونەوە زۆر هاندەر نین ، بۆیە 3 مەرجی قورسیان داناوە ، هەم لە دۆسیەی کۆسۆڤا هەم لە دادگای کەنەدا بەرامبەر کیبیك روون تر گوزارش کراوە,وەلامی داگای لاهایمان تۆمار کرد لەسەروو ،ئەوەش وەلامی دادگای کەنەدایە(کە بۆ ئێمە ئیلزامی نیە):1- إن القانون الدولي لا يمنح الأجزاء المكوِّنة لدولة ذات سيادة، حقا قانونيا للانفصال أحادي الجانب عن الدولة الأم) 2- إن حق تقرير المصير الذي ينص عليه القانون الدولي لا يُنشيء سوى حق تقرير للمصير الخارجي في حالات المستعمرات السابقة ، بۆیەش لەزۆربەی بڕیارەکانی مافی چارەنوس داکۆکی لە یەکپارچەیی و سیادەی دەولەت کراوە،کارگەیشتە ئەوەی نەتەوە یەکگرتوەکان بیکەن بەشێك لە ئاشتی دەولی و ناوی نرا (خطه السلام-1995) کەلەمادەی 17 بەدواوە باس لەو جیابوونەوانە دەکا ودەلێت (ئەگەر ئەو دەرگایە بکەینەوە جیابوونەوە کۆتایی نایەت ) ،تەنانەت لە هەمو هەنگاوەکانی ئەمریکا بەرامبەر عیراق دووپاتی پاراستنی سیادەی عیراق دەکاتەوە .

**2- ریفراندۆم بۆ کۆنفیدراڵی**

لەهەندێ لێدوانی سەرکرایەتی کورد باس لەوە دەکەن کە لە دوای راپرسی و ریفراندۆم داوای کۆنفیدراڵی دەکەین .. ئەو بۆچونە سەرتاپای هەڵەیە لەڕووی یاسایی ئینجا لەڕووی سیاسیش، چونکە ناکرێ میللەت بەیاسا بخەیە ریفرانۆدم و هەموو میللەت داوای سەربەخۆیی بکەن ئینجا ئەو داوایە بخەیتە گفتوگۆ و سازش و دانوستان و بۆ کەمتر لەوەی میلەت داوای کردوە ، لەهیچ شوێنێکی جیهان ئەوە نەکراوە، چونکە ئەوجۆرە ڕێفرۆندامە ئیلزامیە( Mandatory referendum) نەك (Optional referendum) هەردەم گفتوگۆ و سازش و دانوستان پێش ریفراندۆمە، کە گەیشتە ریفراندۆم دەبێت رێز لە ڕای میللەت بگیرێ، بەتایبەتی سەرکردایەتی کورد خۆی هەر لەئێستاوە بە نیازبێت مامەلە بەو ریفراندۆمەبکات زۆر مەترسیدارە، ئاشکرا دیارە مانای رێزنەگرتنە لە ریفراندۆم و ئەنجامەکانی.. ئەوکاتی عێراق چۆن رێزی لێ دەگرێت، ئەو بۆچونە قانونیە یەکجار زیان بەخشە، نابێت وەك بریارەکانی کۆنگرەو کۆنفرانسەکانی حزبی سەیر بکرێت کە بە ریفراندۆم بڕیاڕی لەسەر دەدرێت کەچی خودی سەرۆك حزبەکە پێش سەرکردایەتیەکە پشتگوێی دەخا ، ئەوەیان خراپە بەلام پشتگوێ خستنی ئەنجامی ریفراندۆم یەکجار خراپە.

3. **ریفراندۆم بۆ فشار و کارتی دانوستان** ......هەمان ناوەڕۆك وهەلسەنگاندنی خالی (3)ی هەیە ..ئەو جۆرە ریفرۆندامانە نەکراون .

4. **ریفراندۆم تا بزانین میلەتەکەمان چی دەوێت :** ئەو جۆرە ریفراندۆمە نەکراوە ، سەرکردەی میلەتەکە خۆی داوای ریفراندۆم بکات بۆ ئەوەی بزانی چیان دەوێت ، ئەو پرسیارە (چیتان دەوێت؟) هی سەرکردایەتی کورد نیە ،بەلکو هی داگیرکەرە یان هی نەتەوە یەکگرتووەکانە ، ئەگینا پرسیاریکی زۆر عەبەسیە تازە بەتازە سەرکردایەتی کورد ئەو پرسیارەی هەبیت ، 100 سالی رابووردوو شۆرش وراپەرینەکان بە بانگیشەی ئەو سەرکردانە کراوە کەواتە نابیت ئەو سەرکردانە ئەو پرسیارە بکەن .

5.**ریفراندۆم بۆ ئەوەی تەخویل بدرێتە سەرکردایەتی کورد بۆ هەر دانوستان و بڕیارێکی چارەنووساز** ...لە ڕاستیدا ئەو تەخویلە بەسەرکردایەتی کورد دراوە ،هەم لەرێی شەرعیەتی شۆڕشگێری هەم لە رێی سندوقی دەنگدان ،بۆیە پێویست بە دووبارەی ئەو تەخویلە ناکات و ریفراندۆمی ناوێت .

6. **ریفراندۆم بۆ سەپاندنی ئەمری واقیع (دیفاکتۆ)...** دەبێ ئاگادار بین لە 100 سالی ڕابووردوو بە دەست وبازووی کوردستانی نەمانتوانیە ئەمری واقیع فەرز بکەین مەگەر بڕیاری نێودەولەتی لەگەل بووبێت، ئەوەی کۆماری مهاباد بەپالپشتی سۆڤیەت بوو ،لەو سەردەمەش هەردوو بڕییاری 986 و 688 و دوایش هێلی 36 لە ( عملية توفيرالراحةProvide comfort)، لەوێوە دەسەلاتی ئەمری واقیع دروست بوو ،دوای لە مادەی (1 و127 ) ی دەستوری نوێی عیراق تۆمار کرا کۆتایی بە دەسەلاتی دیفاکتۆی کوردستان هێنرا بوە دەسەلاتی دیگۆرایی(یاسایی) ، لێرە دەبییت ئاگادار بین ئەو جاڕدانەی فیدرالی لەکوردستان بە یەکلایەنانە زۆر جیایە لە گەل جاڕدانی سەربەخۆیی ،ئەوەی یەکەم تایبەتە بەدەسەلاتی ناوخۆیی عیراق(جاروایە پێی دەووتری مافی چارەنوسی ناوەکی) پێویستی بە (یاسای دەولی و سیاسەتی دەولی و علاقات دەولی )نیە ،بەلام ئەوەی دوەم زۆر ئالۆزە وەك لەخالی یەك باس کرا ،بەکورتی سەپاندنی ئەمری واقیع لەسەر ئاستی دەولی جارێ لە ئاستی توانای کورد نیە ، ئەو ئەزمونانەی سەپاندنی ئەمری واقیع هێزی دەوێت ، قوبرس کردی تورکیای لە پشت بوە ،قرم کردی روسیای لە پشت بوە، بەهەمان شێوە ئۆسیتا واخەریکە ریفراندۆم دەکا بۆجیابوونەوە لە جۆرجیا روسیای لەپشتە ،..کۆسۆڤا کردی هەمو ناتۆ و نەتەوە یەکگرتووەکانی لە پشت بوو ، ڤاتیکان کرا دەولەت کەچی مەرجە سەرەتاکانیشی تێدانەبوە تێکڕای خاکەکەی 1000 مەتر بوە ، کەچی لخنشتایین شەش جار لە ڤاتیکان گەورەتر بوو بەهۆی بچوکی خاك بوە هۆی وەرنەگیرانی لە (عصبە الامم) ، ئیسرائیل بە ئەمری واقیع دروست بوە بێئەوەی هەر 3 مەرجەکەی کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆی هەبێت(گەل – هەرێم – دەسەلاتی سیاسی) ...،کە ووتت دیفاکتۆ یەکسەر دەبێت تەماشای هیزی پشتیوان بکەی ، ئەو هێزە بۆ کوردستان جارێ نیەو سەرکردایەتی کوردیش لەو سات وکاتانەی هەبوە وەك دەرفەت لەدەستیان چواندوە ، بۆ ئێستا ئەو هیزە پشتیوانە نیەو کەمتریش کاری لەسەر کراوە بۆیە سەپاندنی ئەمری واقیع ناکرێت و سەرکەوتوو نیە مەترسی دەبێت ئەوەندەش لەدەست بدەین وەك ئەزمونی تامیل لە سریلانکا و ئەزمونەکانی چیچان وقەوقاز .

**لەکۆتاییدا** واپێدەچی هێشتا ڕوانگەیەکی یاسایی روون نیە بەرامبەر ریفراندۆم لەلایەن سەرکردایەتی کوردستان، عادەتەن بەو جۆرە دۆخە دەووترێت ریفراندۆمی بێئامانج ، عەبەسی ، پووچی یاسایی ...

## زیانەکانی ڕیفراندۆمی عەبەسی لە کوردستان

1. کاریگەری سەلبی بەسەر مادەی 140 دەبێت بۆ دواکەوتنی جێبەجێ کردن .

2. کەمکردنەوەی متمانە بە ریفراندۆمی راسەتەقینە .
3. دام ودەزگاکانی کوردستان لە کاتی ئێستا زۆربەی شەرعیەتی لاوازبوە ریفراندۆمیکی ناشەرعیش بکەی یەکجاری ناشەرعیەت ئاوێتە دەبێت....
4. وولاتانی ناوچەکەو جیهان بەخەبەر دەهێنیەوە بێئەوەی ئەنجامێکیشی هەبیت .
5. ئەگەرێکی تر (ئەگەر لاوازیش بێت) دەشێ وەك سالی 2006 ئەو دەنگە زۆرەی نەهێنی،یان ئەگەر کەمتر لە 50%ی هێنا، یان 60% هەتا 70% کەمبووەیەوە، کارتێکی بە هێز بەخۆڕایی دەکەوێتە دەست دەولەتانی ناوچەکە دەلێن دەنگی جیاخوازان بەرەو کەمبوونەوەیە ،خەبات وماندووبوون و خوێنی شەهیدانی 100 سالی ڕابووردوو دەخەیە موجازەفە، ئەزمونێکیش هەیە زۆر وورده و کەمیش باسی لێوە کراوە ، لەهەلبژاردنی 19/5/ 1992 دروشمی پارتی ئۆتۆنۆمی بوو هی یەکێتی فیدرالی بوو . چونکە ئەو کاتی گەندەلیەکان زیاتر ڕوو لە یەکێتی بوو ،لە نێوان بانگێشەی نیشتمانی (فیدرالی ) لەگەل گەندەلی و بانگێشەی ئۆتۆنۆمی (بێ گەندەڵی) دەنگی یەکەم دۆڕاندی، یەکێتی بە فیدرالیەوە 43.8%ی دەنگ هێنا، پارتی بە ئۆتۆنۆمیەوە دەنگی زیاتر لە یەکێتی هێنا گەیشتە 45.2%، ئەو بارودۆخەی ئێستا زۆر وێکچووی ئەو کاتیە، چونکە ئەو ریفراندۆمە بە گەندەڵیەوەیە، ئەگەری هەیە منافسەیەکی وا سەرهەڵداو دەنگ زۆر کەم بێت، ئەوانە هەمووی ئەگەری هەیەو زەرەر وزیانی مەترسیداری دەبێت .
6. لەهەموی خراتر ئەگەر ئەو پرۆسەیە تەنها بۆ ئەوەی بێت بەکاری بهێنی بۆململانێی حزبی.

## باشترین ریفراندۆم (بۆ دەوڵەتی کوردستانی)

لەوانەی سەروو بەڕوونی دەکەوت ریفراندۆمێك هەیە بۆ سەربەخۆیی زۆر جیایە لەگەل ریفراندۆمێك کە (باطله و پوچە- تریڤیاله) هەریەکە رێباز و رێکار و میکانیزمی جیای پێویستە، بۆ دووەم چی پێویست نیە یەکڕیزی و تۆکمەیی و هەتا پەرلەمان و ئامادەسازی ناوێ مادام باطلە ، هەرچی یەکەمە کاری زۆری پێویستە لەهەموو رووێکەوە (ئابوری- سایسی – قانونی – کۆمەڵایەتی – ئیداری – سەربازی- فەرهەنگی ..) وەك نەشتەرگەری دڵ وایە، بەلێدوان و ڕاگەیاندن ناکرێت بەکار و نەخشە و پلان و شارەزایی دەکرێت، هەرچەندە زۆر درەنگە بەڵام ئێستاش دەشێ بەو شێوەیەی خوارەوە کاری لەسەر بکرێت:

**یەکەم- ئاستی ناوەکی** زۆر باس کراوە هەردەبێ دووبارەی بکەینەوە (ڕای گشتی لەسەرە کەچی نەکراوە )
1- بەخێرایی بەگەڕ خستنەوەی دام و دەزگا پەکخراوەکان و ڕێکاری یاسایی وەرگیرێ نەك هەر پەرلەمانی کوردستانی پێویستە ئەگەری زۆرە پەرلەمانی عیراقیشی بوێ .
2- یەکخستنی ناوماڵی کورد .
3- سەروەری یاسا و دروستکردنی دام و دەزگا و پابەندی حیزبی بە یاسا.
4- دەستگۆڕی دەسەڵات و بەرجەستەکردنی زیاتری دیموکراسی.
5- ڕێگا لەهەموو ئەو دەروازانە بگرین کە بەهۆیەوە راپۆرتی نێودەولەتی خراپ لەسەر هەرێمی کوردستان دەردەچێت.

6- کارکردن بۆ گێرانەوەی کەرکوك (تەواوی مادەی 140) بۆ سەر هەرێمی کوردستان کە لەبڕگەی داهاتوو زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

**دووەم: لەسەر ئاستی عێراق**

1. کارکردن بۆ دابەشکردنی عێراق بۆ سێ هەرێم، ئەوە دەروازەی یەکەم و کۆتایی ئەو هەنگاوەیە، هەر بەوەش کەرکوك دەگەڕێـتەوە سەر هەرێمی کوردستان.
2. بەرجەستە کردنی سیستەمی سازان لە عیراق (نظام التوافقی ..وشراكة) راستةقینة(بە درێژتر باسکراوە لەسەروو ).
3. سود لە دیباجەی دەستور وەرگیرێ کە باسی هەڵوەشاندنەوەی سیادەی عێراقی تێدایە.
4. زۆر بەوردی کارکردن لەگەل دەوڵەتی عێراقی ئێستا سەربەخۆکەی کوردستان دەبێتە عاملی سەقامگیری و گەشەی عێراقی عەرەبی (بێ کورد) تەنانەت ڕازی کردنی شیعەش بەوەی ناتوانن عێراقێك بەڕێوە ببەن بەو هاوسەنگیە، بەدەرچونی کورد چارەنوسی عێراق بۆخۆیان مسۆگەر دەبێت، دەکرێ لەگەل سوننەش باس بکرێت کە پێکهێنانی هەرێمێك گەرەنتی گەشە و ئارامی بۆ ئەوان دەکات.
5. بەکورتی لەو دەمە ڕێیە یاساییە نێودەولەتیەکان لە پیش هەریمی کوردستان سەبارەت بە مافی چارەنوس(یان مافی جیابوونەوە ) ئەوانەیە:

ا- ڕێپیدانی نەتەوە یەکگرتوەکان ..ئەوەش ئەو کاتە نزیک تر بوو کە عیراق لە بەندی ٧ بوو .

ب- ڕێکەوتنی کوردستانی وعیراقی

ج- ئەگەر عیراق خۆی دابەش بوو .

د- ئەگەر ناوچەکە کەوتە بۆشاییەکی یاسای دەولی ئەو کاتە ریفرۆندام ڕەوایی وەردەگری ..جاریش وایە لەو بۆشاییە وەسیقەی ئیستقلالی دەوێت کەلەلایەن کۆمەلیک کەسایەتی بنچینەیی وولاتەکە داوا دەکرێت .

**سێیەم: لەسەر ئاستی ئیقلیمی**

ئەو هەنگاوە زۆر زەحمەتە، بەڵام دەتوانن هەم بەپێ ی یاسای دەولی و هەم بەپێ ی دراوسێی زۆر دڵنیایان بکەنەوە کە ئەو هەنگاوە نابێتە هەڕەشە بۆ سەر ئاشتی، کۆمەڵێك ڕێکەوتن بکرێت، ئینجا دەبێت پارچەکانی تری کوردستانیش لەو دەمە یارمەتی دەری هەرێم بن وەك هەنگاوی ستراتیژی، چالاکی سەربازی بوەستێنن بکەونە گفتوگۆ و ئاشتی لەگەل دەوڵەتەکانیان تا ئەو قۆناغە تێدەپەڕێت.

**چوارەم: لەسەر ئاستی دەولی** بڕیارەکان (وقایە – جینۆساید- پێشێلێکی زۆری مافی مرۆڤ....) کە دەبێتە هۆی بەرپا کردنی دۆخێکی قانونی بتوانرێت بەیەکلایەنی ریفرانددۆم بکریت ، (الجمعية العامة للامم المتحدة في 24 اكتوبر 1970 (القرار 2625 الـدورة 25) شـــرطاً وقــائياً Safeguard Clause أو شرط استثناء Saving Clause وأسس عليـــــه حـــق انفصــال علاجــــــي Remedial Secession )

له کۆتاییدا دروست کردنی دۆسیەیەکی دۆزی کوردستان به پێی یاسای نێودەولەتی وەک ئەوەی (ڕێکخراوی ستاندەر )کردوویەتی بەناوی (الملف القانونی لحق تقرير المێير لشعب کوردستان وفق قوانين الدوليه ) كه کورتيەكەی ئەوەی خوارەوەیه :

هەر له ڕێكەوتنەکەی شیخ ئیدریسی بدلیسی قیمەتی قانونی تێدایه تادەگاته ، رێكەوتنی سوڵتان محەمەد رەشاد و دواییش محەمەد واحیدەدین و نوێنەری کورد بۆ مافی چارەنووس له ١٩١٤-١٩٢١- دان پیاهێنانی دەوڵەتی عوسمانلی بۆ دەسەڵاتی شێخ مەحمود بەپێی بروسكەی (عەلی ئیحسان پاشا) له٣٠/تشرينييەكەم/ ١٩١٨ .-تادەگاته گەڕانەوە بۆمادەی ٦٤ی سیڤەر ڕەهەندی ریفرۆندامی تێدا یه,

ئینجا لایەنه یاساییەكانی كۆنگرەكانی سیڤەر ١٩٢٠، كۆنگرەی قاهیرەی١٩٢١و لائیحەی ئینتدابی بەریتانیای١٩٢٠ بەسەر عێراق. تاوای لێهات عیراق وكوردستان به مادەی جیا مافی چارەنوسیان بۆ دیاری كرا ،عیراق بەمادەی ٩٤ وكوردستانیش به مادەی (٦٣).

تادەگاته لایەنه یاساییەكەی ناو عیراقکه بریتین له(دەستوری ١٩٢٥، بەڵێنی حكومەتی بەریتانی و عێراقی هاوبەش، بەڵێنی عوسبەتول ئومەم له ١٩٢٢، ١٠ تەعەهوداتەكەی ساڵی ١٩٣٢، دەستوری ١٩٥٨، بەیانی ٢٩ حوزەیران، بەیانی (١١)ی ئازار، یاسای ئۆتۆنۆمی ١٩٧٤، بەندی (٧) و بڕیاری ٦٨٨، بڕیاری ٩٨٦ كه ڕێژەی ١٣% تایبەت له خۆراک بۆ كوردستان دیاری كرا لەلایەن نەتەوە یەكگرتوەكان...، یاسای انتقالی ٢٠٠٣، دەستوری عێراقی نویێ).

لایەنه یاساییه نێودەوڵەتیەكانی :كوردستان خاوەنی هەرسێ پایەی دەوڵەته (هەرێم و گەل و دەسەڵاتی سیاسی) ئەویش بەگوێرەی مادەی (١)ی رێككەوتنامەی مونتیڤیدیۆ، مادەی (١)ی بەشی یەكەم و ماددەی (٥٥)ی میساقی نەتەوە یەكگرتوەكان، مادەكانی (٥٨-٦٠)ی (فصل العاشر- قبول اعضاء جدد)ی (مجلس الامن)، بڕیارەكانی ژ:١٥١٤ی خولی(١٥)ی ١٤/دیسمبر/، ١٩٦٠، بڕیاڕی ژ: ٢١٠٥ خولی (٢٠)ی دیسمبری ١٩٦٥، بڕیاڕی ژ:٢٦٢٥ی خولی ٢٥ی ٢٤/ئوكتوبەر/١٩٧٠ ، بڕیاڕی ژ: ٣٠٧٠خولی(٢٨)ی نوڤمبری ١٩٧٣ ، هەروەهابڕیاری ٣٣١٤ساڵی ١٩٧٤......)

ئەوە لایەنی یاسای دەولی پڕ دەكاتەوە، بۆ سیاسەتی نێودەوڵەتیش ئەو هەنگاوانەی خوارەوە پێویسته :

١. دروست كردنی نمونەیەكی جوان له دەسەڵاتی كوردی له سەروەری یاسا و پیادەی دەستور و پڕۆسەی دیموكراسی، هەڵبژاردنی ئازاد و ڕاستەقینەو دەستگۆڕی دەسەڵات، پاراستن و پێشێلنەكردنی مافەكانی (مرۆڤ و ئافرەت و رۆژنامەوانی..)، پێكەوە ژیان لەگەڵ پێكهاتەكان.

٢. پاراستنی سنورەكانی نیودەوڵەتی لەگەڵ دەوروبەر، وەک کیانێک نەبێته هەڕەشە بۆسەر دەوروبەر .

٣. بتوانێ (مقەویماتی) ئابوری و سیاسی و فەرهەنگی و تعلیمی و كۆمەڵایەتی و... بسازانی بۆ دەوڵەت، لەدوای سەربەخۆ بوونی نەبێته بار قورسی بۆ (كۆمەڵگای نێو دەوڵەتی) له برسیایەتی و هەژاری و پیس كردنی ژینگه و پێ شێلی یاساو ڕێكەوتنه نێودەوڵەتیەكان.

٤. لەسەر ئەو بنچینانه بتوانی بەرژەوەندی تەوەرو بارسته نێو دەوڵەتیەكان لەگەڵ بەدەوڵەت بوون هاوتەریب بكەی.

٥. لەکۆتایدا کە یەکەم هەنگاوی دەست کردنە بەدەولەت دروست کردن  ئەویش ئەوەیە پیویستە داوانامەیەکی یاسایی بە دیباجەیەکی میژوویی وسیاسی زۆر مەنتیقیانە پێشکەش بە (ئەنجومەنی ئاسایش) بکرێت کە پێکهاتوە لە (١٥) ئەندام، پێنجیان هەمیشەییە و دەیەکەی تریش هەر دوو ساڵ جارێک هەڵدەبژێرێت کە بریتین لە: مەغریب، هند، تۆگۆ، خوارووی ئەفریقا، گواتیمالا، کۆلۆمبیا، ئازەربیجان، ئەلمانیا، پاکستان، پورتوگال.

**تیبینی** : زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش مورتاح نینە لە پرسی جیابوونەوە چونکە خۆشیان لە میلەتی جیاو کەمایەتی و زۆرایەتی پێکهاتوون .

## هەنگاو بەرەو دەوڵەت بوون

## هەڵوەشاندنەوەی سیادەی عێراق و بەرپا کردنی سیادەی هەرێم

ئەو هەنگاوە ناتوانین ناوی لێبنێین (هەڵوەشاندنەوەی سیادەی عێراق بە پێی یاسای نێودەوڵەتی)، بەڵکو دەتوانین بڵێین (هەڵوەشاندنەوەك کە یاسای نێودەوڵەتی پێشێل نەکات)، هەڵبژاردنی دەستەواژەی دادگای لاهای بۆ پرسی کۆسۆڤا زۆر دەقیق و یاسایانەیە کە ووتویەتی  (لاینتهك قوانین الدولیە) نەیووتوە (موافق لقوانین الدولیە). بەو ووردەکارییە دەچینە نێو ئەو بابەتە یاساییە هەستیارە.

**دروست بوونی سیادەی عێراق**: لە بەر ئەوەی  عێراق بەو قەبارەیەی ئێستا بوونی سیاسی نەبوە، پەیوەندی سیاسی ویاسایی لە پرۆسەیەکی میژوویی دروست نەبوە لە نێوان (گەل و خاك و دەسەڵاتی سیاسی)، بۆیە کۆمەڵێك پرۆسەو بڕیاری نێودەوڵەتی دروستی کردوە، سەرەتا لە مادەی (1) سایکس پیکۆ (1916) هەردوو ویلایەتی بەسرە و بەغدا ئامادە کرا، جیاکردنەوەی عیراق لە دەولەتی عوسمانی بە پێی مادەی (94 و 132)لە ریکەوتنامەی سیڤەر(1920) ،بە پێی مادەی 27 یش سنوری دیاری کرا ، دوای بە پێی مادەی 22ی بەندی یەکی عهدی عوسبە عیراقی عەرەبی  دروست کرا (1921)، دوای 5 سال ئینجا سیادەی کوردستانیشی خراسەر بە پێی جەلسەی ژ:37ی (عصبە الامم)رۆژی 1925/12/16 ،یەکەم تەقەلای پارچەکردنی سیادەی کوردستان لەبڕگەی (4)ڕاسپاردەکانی وەزارەتی هندی بریتانی ژ: (7701-B) دێت , ئینجا نوسراوی ژ:4/3330 ی  برسی کۆکس داوا لە حکومەتی عیراق کرا کوردستانی خواروو بلكێندرێ، لە بڕگەی(8)ی مادةی  (15) عهدی عوسبة  تۆمارکرا , دوای لە میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان (بڕگەی 7ی مادەی دوو) چەسپا ، هەمویان دەبنە پالپشت بۆ مادەی(1)ی دەستوری ئێستای عیراق کەدەلێت : (جمهورية العراق دولةٌ اتحادية واحدة مستقلةٌ ذات سيادة كاملة ) .

**هەلوەشاندنەوەی سیادەی عیراق:** بە پێی پرۆسەی دروست بوونی دەولەتی عیراقی ،دەولەت وسیادەیەکی پیکهاتەیە (دولة مركبه- etat-compos ) ، زیاتر لەوەش لە دوو ئیقلیمی جیاش پێکهاتوون ،عیراقی عربی و کوردستانی خواروو ،ئەوەش مانای (شراكه) دەدا ، ئەو دۆخە قانونیە لە بڕیارو ڕاسپاردەکانی (عصبه الامم)و (ڕاپۆرتی ویلایەتی موسل )هاتبوو(وەك لەسەروو نیشان درا)، لةڕێنمایی ونستۆن چةرچل کة لة 1922/7/11 بۆ (بیرسي کۆکس) پیشنیاری کۆنفدرالی نێوان کوردستان وعیراق دةكات , لە دەستورو یاساکانی دەولەتی عیراقیش هاتبوو ، ئالاو دروشمی عیراق بریتی بوو لە دوو ئەستێرە ، کە گوزارشی لەو ڕاستیە دەکرد بە پێی نوسراوی (مس بیل)ی رۆژی 1921/8/28 و هەروەها مادەی (4)ی دەستوری 1925 و یاسای(شعار الدولة العراقية رقم 25 لسنة 1931/3/3) مادەی(1) لەو یاسایە ، هەلوەشاندنەوەی دەولەتی سادە زۆر زەحمەتە بەلام هەلوەشاندنەوەی دەولەی پێکهاتەو شەراکە زۆر ئاسان ترە ,هەنگاوە یاساییەکانی تاڕادەیەک پیچەوانەی دروست بوونیەتی , ئەگەر لە وولاتیکی فرە نەتەوەو پیکهاتە دیسان دەولەت بە یەکسانی کاری بۆهاولاتیان نەکرد ومافی مرۆڤ تیایدا بەردەوام پیشیل کرا ئەوا ئەوجۆرە میلەتەی خاوەن هەریم مافی جیابوونەوەی دەبێت(بروانە : الجمعيه العامه- جلسه :۱۲۰ -سال ۲۰۱۰) ،سیادەی لاوازدەبێت بواری یاسایی بۆ لێکهەلوەشاندنەوەی سیادە دەبێت .
باشترین هەنگاوی سیاسی ویاسایی بەو ئاڕستەیە ئەوەیە نەیەلی عیراقیکی مەرکەزی دروست بێت ، بەلکو وەك سروشتی خۆی عیراقیك پیکبێت لە 3 هەریمی شیعەو سونەو کورد .

**بەرپا کردنی سیادەی کوردستان بە پێوانەی یاسای نێودەولەتی**

دەبی دووبارەو چەند بارەی بکەینەوە بەرپاکردنی ئەو سیادەیە لە ژێر بارودۆخی قانونی سەردەمی عیراق لە بەندی (7)زۆر ئاسان تربوو لە ئێستا کە سیادەی عیراق گەڕاوەتەوە سەر کوردستان ، بەرپا کردنی سیادەی کوردستان تاڕادەیەك بە پێچەوانەی لکاندنی کوردستانە بە عیراق کە لەسەروو باسکرا، هەنگاوەکانی دروست کردنی سیادەی هەرێم (واتە بناغەی سەربەخۆیی)بەو هەنگاوە یاساییانە دێتەدی:

1. ڕاستە کوردستان (لە بنەچەدا)هەر ۳ مەرجی یاسایی بەدەولەت بوونی هەیە (بە پێی مادەی یەکی کۆنگرەی مۆنتیڤیدیۆ )،مەشمولەبە مادەی (۱)ی بەشی یەکەم و ماددەی (٥٥)ی میساقی نەتەوە یەکگرتوەکان،مادەکانی(٥٨-٦٠)ی (فصل العاشر- قبول اعضاء جدد)ی (مجلس الامن)، بڕیارەکانی ژ:١٥١٤ی خولی(١٥)ی ١٤/دیسمبر/ ١٩٦٠، بڕیاڕی ژ: ٢١٠٥ خولی (٢٠)ی دیسمبری ١٩٦٥، بڕیاڕی ژ:٢٦٢٥ی خولی ٢٥ی ٢٤/ئوکتوبەر/١٩٧٠ ، بڕیاڕی ژ: ٣٠٧٠خولی(٢٨)ی نوڤمبری ١٩٧٣.. بەلام لەو دەمە کۆمەلیك کیشەی مەترسیداری هەیە دەبێت چارەسەر بکرێت ، هەریمی کوردستان پارچە پارچەیە و زۆنەکانی زەردوسەوز وناوچە دابڕیندراوەکان وهەریمی قەندیل وسیدەکان وگارا..، لەوددمەش وەك گەل خراپ پەرتەوازە بووینە ،دەسەلاتیش شەرعیەتی زۆر لاواز بوە بە هۆی بەسەرچوون ولەکارکەوتن و لیکترازانی دام ودەزگاکان کە دەسەلاتی سیاسی کوردستان پێکدەهینی،رەنگە نەتوانی سیادەی ناوەکی و دەرەکی پێگوزارش بکرێت ، بوونی هیزیکی بیگانەی وەك تورکیا لە هەریمی کوردستان دیسان ئەو سیادەیەی

هەریم (لە رووی قانونی) ناتەواو دەکات ، بەتایبەتی کاتێ سەرکردایەتی کورد بە ئاشکرا دەلێ ئێمە ناتوانین سوپای تورکیا دەربکەین یان ڕێگری لە هاتنی بکەین ، ئەوەش دانپێهێنانێکی ڕوونە کە ناتوانێ ئەو بەرپرسیاریەتیە دەولیە هەلگری لە پەیوەندیە نێودەولەتیەکان .

2. پابەند نەوونی عیراق بە بەلینە نیودەولەتی و ناوەکیەکانی خۆی سەبارەت بە سیادەی کوردستان وەک : راسپاردەکانی راپۆرتی ویلایەتی موسل سەبارەت بە یەکگرتنی عیراق وکوردستان ،ئینجامادەی ١٦ی ئینتداب، مادەی٤ی کۆنگرەی قاهیرە، دان پیا هێنانی بەریتانی لە ١٩١٩ بە چارەنوسی کوردستان وجاریکی تر لەگەل عێراق لە٢/دیسمبر/ ١٩٢٢، بڕیارەکانی خولی (١٦)ی مانگی ١٩٢٥/١٢ی عصبە الامم سەبارەت کورد ،١٠ بەلێننامەکەی سالی ١٩٣٢ کە بە(عصبەالامم)درابەتایبەتی (تەعەهودی ژ:٩و١٠)...، ریکەوتنامە ناوخۆییەکانی وەک : قرار مجلس الوزراء ١١/تموز/١٩٢٣ - بیان شباط ١٩٦٤ - بیان ٢٩/حزیران/١٩٦٧ - اتفاقیه آذار ١٩٧٠ - قانون الحکم الذاتی لعام ١٩٧٤ , تادەگاتە پێشیلی ئێستای دەستور, دەستورەکانی پیشووی عیراقیش هەر پیشیل کراوە ,لەوانە: ( المادەالخامسە من القانون العراقی الاساسی لعام ١٩٢٥ – المادە الثالثة من دستور ١٩٥٨ -المادە واحدە والعشرین من دستور ٢١ ایلول ١٩٦٨ المؤقت ١٩٦٤- تعدیل (الدستور١٩٦٨) وفق اتفاقیە اذار لعام١٩٧٠ – المادە الخامسە من الدستورالصادر فی ١٦ یولیو ١٩٧٠ – المادە السادسە من مشروع دستور العراق الصادر فی فی ٧ تموز ١٩٩٠ –المادە الثالثە والخمسین من قانون إدارە الدولە المؤقت فی العراق - المادە الاولی الی اربعەثم المواد مئە وسابعە والعشرین الی المئە والعشرین) من دستور الجمهوریە العراقیە -٢٠٠٥ ) . یاسای انتقالی ٢٠٠٣، تا دەگاتە دەستوری تازەی عیراق کە بەدەستوری فیدرالی ناوزەد دەکرێت .

٣. دەولەتی عیراق لە سالی ١٩٣٢ تەعەهودی بە عوسبەتولئومەم داوە (١٦ تەعەهود) لەبەرامبەر گەڕانەوەی سیادەی و نەمانی ئینتداب بە پێی مادەی ٢٢ی میساقی عوسبە ، مادەی(٤)ی بریاری عصبە الامم سالی١٩٣٢ ،بەتایبەتی تەعەهودی (ژ: ٩ و ١٠)سەبارەت بە سیادەی کوردستان، لەلایەکی تریش عیراق لەسالی ١٩٧١ەوە مۆری لەسەرهەردوو عەهدی تایبەت بە (الحقوق المدنیە و السیاسیە) و(الحقوق الاقتصادیە والاجتماعیە والثقافیە- کە لە لای نەتەوە یەکگرتوەکان دەرچوە لە ١٩٦٦/١٢/١٦ ، لە مادەی ١ و٢ مافی چارەنوس هاتوە) کردوە و دەبێتە بەشێک لە یاسای عیراقی ،

٤. عیراقیکی خاوەن سیادەی تەواو پیشووتریش نەبوە ,لەسەردەمی عوسمانیش کوردستان ئیالەت و ویلایەتی سەربەخۆی هەبوە ،عیراق هەرنەبوو ،تەنانەت لەدوای بڕیاڕی دروست کردنی دەولەتی ٣ حکومەت لەخواروو (کەربەلا ١٩١٨-١٩٢٠)و ناوەڕاست (بەغدا ١٩٢٠-...) و لە کوردستان (سلێمانی ١٩١٨-١٩٢٣) دروست بوو ، ئەوەش گوزارش لە لێکجیابوونەوەی سیادەی ئەو ناوچەیە دەکا ، کەچی بە پێکلکاندنیان تا ئەو ساتە سێ پێکهاتەکانی عیراق نەگونجاون ،هەردەم ژێرخانی سیادەی جیای هەریمی کوردستان سەرخانی دەسەلاتی تایبەت بەخۆی دروست کردوە , بزوتنەوەکانی شێخ مەحمود تاسالَی ١٩٣٢ی خایاند،،بزوتنەوەی شیخ ئەحمەد، ئینجا لەسالَی ١٩٣٥ بزوتنەوەی بەکر سدقی لەشێوەی ئینقلاب لە بەغدا رویدا بۆ گێڕانەوەی مافی سروشتی کوردستان، دوای جەنگی جهانی دوەمیش سەرهەلَدانی حزبە کوردستانیەکان و شۆڕشی ئەیلول و... لەوکاتی تا ئێستا دیاروزانراوە.

٥. له دوای ڕووخانی عوسمانی ودروست بوونی دەولەتانی ناوچەکە ،کوردستان وعیراق هەریەکەبه ماددەیەکی تایبەتی له عوسمانی جیابوینەوه، کوردستان به مادەی(٦٢)ی سیڤەر ،کەچی عێراق بەپێی ماددەی (٩٤)، لەهەمو کۆنگرەکانی ئاشتی دۆسیەی کوردستان ودۆسیەی عیراق جیابوه ,لەدوا ساتەکانی عوسمانیش بەپێی بروسکەی عەلی ئیحسان پاشای نوێنەری سوڵتانی عوسمانی له ١٩١٨بۆ شێخ مەحمود کە دان بە حکومەتی شێخ مەحمود دەهێنآ لە کوردستان بەلام دانی بە عیراق و تورکیا نەهینا بوو ، دروست بوونی عیراقیش بە دوو سیادەی جیا هاتبوو ،وصایا وزاره الهند الی وزاره الخارجیه) دەربارەی سیاسەتی بریتانیا لە عیراق کەله ٢٢/کانون یەکەم/ ١٩٢٠ له مادەی(٥) دەقەکەی به کۆنفیدرالی نێوان کوردستان وعیراق هاتبوو .

٦. وێران کردنی شارستانی و دام ودەزگاو ژێرخانی ئابووری و فەرهەنگی ئەوهەرێمە (لە غیابی سیادەی ڕاستەقینه) لەلایەن خاوەن سیادەیەکی ساختە تاکار گەیشتە جینۆساید چەندین جار ،هەندیکیان گەیشتۆتە نەتەوەیەکگرتوەکان وەک ئەوەی سالی ١٩٦٣ (رساله رئیس بعثه الاتحاد السوفیتی إلی الامم المتحده ، المجلس الاقتصادی والاجتماعی- للتداول العام رقم ٣٨٠٩٩/E تموز ١٩٦٣الجلسه ٣٦، الماده رقم١ فی جدول الاعمال.) , دواجار ناوی ئەنفال بوو کە بە فەرمی لەلایەن دەسەلاتی عیراقەوە دانی پیاهێنراوە کە (جینۆساید)هەژمارکراوە ،کە لە دانیشتنی رۆژی١٤/٤/٢٠٠٨و دوای سەرۆکایەتی کۆمار پالپشت بەوەو بەمادەی ٦١ی دەستور بڕیاڕی ژ:٢٦ی سالی ٢٠٠٨ی دەرکردکەتیایدا هاتوه :ئەوەی بەسەر کوردهات لە ئەنفال جینۆسایدە بەهەمو پێوەرەکان . " سیاسه حرب الاباده ضد الکرد من قبل الحکومه العراقیه" ئەوەش بە ڕوونی دەکەوێتە ژێر بڕیاڕی جینۆساید(إذ تری ان الجمعیه العامه للامم المتحده، بقرارها ٩٦ (د – ١) المؤرخ فی ١١ کانون الأول / دیسمبر ١٩٤٦، قد اعلنت ان الإباده الجماعیه جریمه بمقتضی القانون الدولی، تتعارض مع روح الامم المتحده واهدافها ویدینها العالم المتمدن) دوا جاریش ئەو جینۆسایدەی ڕووبەڕووی کوردانی ئیزیدی بوویەوە باشترین بەلگەیە کە پێکەوە ژیان لەژێر سایەی (یەک سیادەی) عێراق جینۆساید بەرهەم دێنیت.

هەموو ئەوانە بکرێتە بنچینەیەک بۆ ئەوەی ریفراندۆم بکرێت لە ژێر سایەی سەربەخۆیی سیادەی هەرێمی کوردستان (بە ناوچە دابڕێندراوەکانیشەوە)، هەر بەو دەروازە یاساییانەش دەتوانرێ دۆسیەی کوردستان لە دۆخی قانونی (مافی جیابوونەوە ) وەرچەرخێنیە (مافی چارەنوس) .

لە دەرئەنجامی ئەو توێژینەوە دەرکەوێ ئەو ریفراندۆمەی سەرکردایەتی کورد باسی دەکات، ئەنجامێك بەر جەستەی نابێت، هەربۆیە پێشنیار دەکەین هەموو تواناکان بخرێتە گەڕ بۆ ریفراندۆمی کەرکوك و ناوچە دابڕێندراوەکان، ئینجا بینای دەوڵەتی کوردستان بە کردەیی بکرێت.

